زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١٨)

# زەیدی کوڕی حارثە

حبیب محمد سعید

ساڵی ١٤٠٦ک

# زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١٨)

# زەیدی کوڕی حارثە

حبيب محمد سعيد

چاپخانەی ئیرشاد ـ بەغداد
ساڵی ١٤٠٦ك

# بسم الله الرحمن الرحيم

ئازیزە کانم ، ئــەی هاوەڵە شیرینە کانی پێغەمبەری خــوا ••

سەلامێکی گەرم و گوڕتان پێشکەش ئەکەم •

کاتێ کە چمکێ لــە ژیانی هەر کامتان شــارەزا ئەبم ، زیاتر گەورەیی ئیسلامم بۆ دەرئەکەوێ ، کەوا ئێوەی مەرد و قارەمانی پەروەردە کردووە •• بۆیــە شانازیی پێوە ئەکەم ـ بــە پێی توانــا ـ ژیانتان پێشکەش بکەم بە موسڵمانان ، تا بەشکوم ـ بە کۆمەکیی خــوا ـ بتوانــن موســـڵمان و نەفام جیا بکەنــەوە و ئیتــر بــا چاوبەستکردن بەس بێ و کەم شیری بێ هــەوێن بنێن ••

# پێشکەش

پێشکەش بێت :

● بەو موسڵمانانەی کە لە وەزعی ئەمڕۆی خۆیان و ئاینەکەیان شارەزان و بەو پێیەش دەستیان داوەتە هەوڵ و کۆشش بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای « لا اله الا اللـه » .

● بەوانەیش کە ئامادەن گوێ لە دەنگی راستەقینەی مێژوو بگرن ، تا بزانن کێ بە راستیی ، بێ فێڵ و دەستبڕیین ، خزمەتی گرۆی ئادەمیی کردووە ..

# پێشەکیی

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وآله وصحبه أجمعين •**

تەنها ئیسلام رزگارکەرە •• بەرزیی و پایەداریی هەردوو جیهان تەنها لای ئیسلام دەست ئەکەوێ••• هەموو رێبازێ گاڵە و فشـــە و هاش و لووشی چـەند رۆژێکـە ، دێت و دەڕوا ، ئـەنجامـەکـەشی بۆش و بێمایەیە ••

ئەوانەی دڵ بەو رێبازانە خۆش ئەکەن ، مێشکیان بچووك و بیریان تەسك و چاویان کەم بینایە • توانایان نیـە لـە رێگای سەرفرازیی تـێ بگەن •• چـەندێ گەورە و ناودار بن ، بەم بیروهەستەیان ، ئینجا زیاتـر بچووك ئەبنەوە ••

چەندێ هـەڵمەت بۆ پێشـەوە بەرن ، لە سایەی نەفامییدا ، ئینجا بەرەو دواوە پێیان ئەخلیسکێ ••

بەڵام مرۆڤە دڵپاکە خواپێداوەکان ، رەحمەت

و ســـۆزی به لێشـاوی خوایـان به سەرا ئەڕژێ ..
بەرنامەی خوا ، به شێوەیەکی ناوازە دەستی یارمەتییان
بۆ درێژ ئەکا و پەروەردەیەکی تێرو تەواویان ئەکا و
بۆ رزگاریی ئادەمییەکان ئەیان خاتە کار ..

• نامیلکـەی ئـەمجارەمـان کورتەیـەکی ژیانـی
ئادەمییەکە کە ئیسلام گەیشـتە فریـای ، هـــەروەك
گەیشتۆتە فریای ملیۆنەهای وەهـا ، تا لـە نـەفـامیی
رزگاری کا و دڵە ئامادەکەی لە نووری قورئان پڕ کـا
و بیێتە هەڵگری رێگای هیدایەت بۆ ناسینی خـــوای
گـەورە ..

**نووسەر**
**سیروان**
**١٤ی/صەفەر/١٤٠٦**

# یاسای نەفامیی

هەر کاتێ نەفامیی باڵی ڕەشی کێشا بە سەر ژیانی ئادەمیزادا ، هیــچ شتێ لە شــوێنی خــۆیا نامێنێتەوە •• هەموو کاروبارێ تێك ئەچێ •• هەموو خراپە و تاوانێك لــە دەستی ئادەمیزادی ستەمکار ئەوەشێتەوە ، زۆریش بــە ناڕەوا ئــەچەوســێنرێتــەوە •• مرۆڤ ویژدان و غیرەتــی بەنــج ئەبێ •• تەنهــا بیــر لــە ڕابواردن و دەستڕۆیشتنێکی ئاژەڵیی و دڕندانە ئەکاتەوە •

ئەو کاتەی کــە هێشــتا قورئانی پیــرۆز نەهاتبوە خوارەوە نەفامیی گەیشــتبووە چڵەپۆپە •• ســــەراپای سەرزەویی پڕ بوو لــە ستەم و جەور بۆ بەدەستهێنانی ژیانێکی کورت •• بە تایبەتیی دوورگەی عــەرەبیی کە یاســـای خێڵایــەتیی و ڕەگــەزپەرستیی دەورێــکی دڕندانەیان ئەبینیی •• یاســـای « أنصــر أخاك ظالماً أو مظلوماً ، واتە : پشتگیری براکەت بە ئیتر سا ستەمکار بێت یان ستەملێکراو » هەموو مێشکێکی پڕ کرد بوو••

هەموو بیر و هەستێکی خەڵکەکە بۆ ئەوە بوو چۆن هۆزەکەی خۆی سەرخات و بە رەوا و ناڕەوا بەرگریی لێ بکا ..

ئەوە بوو جارێکیان هەندێ لە هۆزی نەوەی قەین کتوپڕ دایان بە سەر هۆزی نەوەی مەعندا و شمشێریان خستە گەردنی ئەو خەڵکەوە بێ ئەوەی ئاگادار بکرێن و رەنگە هۆیەکی ئەوتۆیشی نەبووبێ .. دوای دەست وەشاندن دەستیان کردە تاڵان و بڕۆ و هەرچییان بەردەست کەوت لە ئاژەڵ و وشتر دایانە بەر و ژن و منداڵیشیان بە دیل گرت و کردنیانە کۆیلە و بەندە ..

بەو هەڵمەتە هۆزی مەعن زیانێکی زۆری لێ کەوت ، لە کاتێکا زیان و گوزەران و ئاژەڵ و بەروبووم بەو ئاسانییە دەست نەئەکەوت .. بەڵام مێشکی نەفامیی نە سۆزی تیایە و نە بەزەیی ..

ئەم رووداوە لە کاتێکا بوو کە سوعدای کچی

ئەعلەبەی خێزانی حاریثەی کەعبیی بە خۆی و زەیدی کوڕیەوە هاتبووە ناو خزمەکانی لـە نەوەی مەعـن بۆ سەردان و چاوپێکەوتنی خزم و خوێش ..

جا یەکێ لەوانەی بە دیل کەوتە دەست نـەوەی قەین زەیدی کوڕی حاریثە بوو ، ئەویشیان دایە بـەر و بردیان ..

زەید لەو کاتەدا منالێـکی بچـووك بوو . تـازە تەمەنی بەرەو هەشت سالیی خۆی ئەکوتـا ..

بە پێی یاسای نەفامیی سـەربەستیی زەید زەوت کـرا ، بێ ئەوەی هیچ تاوانێکی کردبێت و بێ ئەوەی ئاگای لـە هیچ جەنگ و دوژمنایەتییەك بێت .. بەلام نەفامیی وەك شێت وایە قسەی لەگەڵ ناکرێ و هیچیشی لـێ ناگیـرێ .. نەفـامیی زۆر لای ئاسـاییە هەموو هەنگاوێك بگیرێتە بەر ، ئـەگـەرچی دەرهـەق بـە بێتاوانانیش بێت ، بەو مەرجەی بەرژەوەندیی تیا بێت..

زەیدی کۆرپەی بێتاوان ـ وەك چەندەها مرۆڤی تـر ـ بەرەو بـازاڕی عوکاظ خرایـە رێ .. لـەوێ

مامەڵەی خرایە سەر و فرۆشرا •• بە ناڕەوا کرایــە بەندە•• لە دایك و باوکی سەنرا و کرایە خزمەتکاری ماڵان •• دایکی داماوی ، کوڕی خۆشەویستی لـێ سەنرا و بە دەستی خاڵیی و هەناسەی ساردەوە گەڕایەوە ماڵــەوە ••

لەو لاوە دەوڵەمەندێکی قوڕەیشیی ، کـە ناوی حـەکیمی کـوڕی حـەزامی کوڕی خووەیلیـد بوو ، زەیدی کڕیی بە چوارصەد درهەم •• نەك تەنها زەید ، بەڵکو چەند منداڵێکی لەو بەندانەی کڕیی و هێنانیەوە بۆ مەککە •

کاتێ کـە خـەدیجەی کچی خووەیلیـد لـــە گەڕانەوەی حەکیمی برازای ئاگادار بوو ، ڕۆیشت بۆ لای بۆ بەخێرهاتنەوە کردنی ، ئەویش لە جیاتی دیاریی و پێشکەشیی بە پووری وت :

پوورێ گیان ، لە بازاڕی عوکاظ چەند منداڵێکم کڕیوە ، جا بزانە کامیانت بە دڵە لە ناویانا هەڵی بژێرە و پێشکەشت بێت ••

خەدیجەی ژیر و سەلیقەدار بە جوانیی لە منالەکان ورد بوویەوە تا بەندەیەکی زیرەکیان لێ هەڵ بژێرێ .. دوای سەرنجدان زەیدی کوڕی حاریثەی هەڵ بژارد ، چونکە بە شێوە لە بەندەیەکی ژیر و زیرەك ئەچوو .. حەکیمیش ڕەزامەندیی خۆی دەربڕیی و زەیدی خستە گەل خەدیجە و ئەویش بردیەوە ماڵەوە ..

خوای گەورە ڕۆژی بە خەیری لە زەید کردەوە ، هەر وەك لە دایك و باوکی سەنرا ، گەیاندیە دەستێکی پڕ لە سۆز و بەزەیی ..

خەدیجە ئافرەتێکی دامەزراو و پڕ دانایەتیی بوو .. قورس و سەنگین بوو .. خاوەنی سامان و دارایی بوو .. خاوەنی ڕێز و پایەیەکی بێئەندازە بوو لە نێو قوڕەیشا ..

دوای ئەوە زۆری پێ نەچوو خەدیجە شووی کرد بە سەرداری مرۆڤایەتیی .. بە خۆشەویستی

خـوا •• بە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا ـ صلی الله علیه وسلم ـ دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت لە رەوشت و خووی پیاوانەدا هاوتای نیە و سەرزەویی پیـاوی وەکو ئەوی بە خۆیەوە نەدیوە و نایشبینێ ••

جا دوای گواستنەوە و دامەزران ویستی خەڵاتێکی زۆر بەنرخ و بەها پێشکەش بە مێردی خۆشەویستی بـکا ••

جا هەرچـەندە خـەدیجە خـاوەنی سـامان و داراییەکی زۆر بوو و ئەیتوانیی چاکترین دیاریـی پەیدا بـکا بۆی ، بەڵام بڕیاری هاتە سەر ئەوە هیـچ خەڵات و دیارییەکی دەست ناکەوێ وەك زەیدی ئازیز و رەوشت بەرز •• بۆیە پێشکەشی کرد ••

جارێـکی تر خـوا دەرووی لـە زەیدی بەنـدە کردەوە • جاران تەنها لە سایەی سۆز و میهرەبـانیی خەدیجەدا ئەژیا ، کە زۆر لە دایکی زیاتر دڵی پێی ئەحەسایەوە •• وا ئێستا کەوتە سایە و سێبەری سۆز

و میهرەبانیی موحەممەدی. یەکەم پیاوی مرۆڤایەتیەوە، کە چەندان قات زیاتر جێگەی باوکی بۆ گرتبوویەوە، بگرە بە هیچ شێوەیەك هەستی بە بێ کەسیی و بە دووریی کەس و کار و خزمەکانی نەئەکرد ..

زەید کەوتە خۆشیی و شادمانییەوە .. لەو پەڕی بەختەوەریی و کامەرانییدا ژیانی ئەدایە سەر .. هەرگیز نە خۆی و نە خاوەن ماڵ حیسابی بەندەیەتیان بۆ نەئەکرد .. لەوپەڕی ناز و نیعمەتا ژیانی ئەدایە سەر .. ئەمەش لە کاتێکا بوو کە هێشتا قورئانی پیرۆز نەهاتبووە خوارەوە سەر موحەممەدی پێشەوامان ـ صلى الله عليه وسلم ـ .

بەڵێ ، زەید لەوپەڕی خۆشییدا ئەژیا ، بەڵام دایکی جگەرسووتاو و کۆستکەوتووی بەمەی نەئەزانی .. هەمیشە خەریکی گریە و فرمێسك ڕێژان بوو بە دوایا .. خەو و حەسانەوەی لا هەڵ گیرا بوو .. هەناسەی بە دوای زەیدی جگەرگۆشەیا هەڵ

ئەگینشا •• نەی‌ئەزانی دەستی کێ کەوتووە و چ ماڵێ مەنزڵی شەو و ڕۆژیەتی ••

ئـای کـە دایـك و بـاوك و خوشـك و برا و کەس‌وکار فرمێسـك ئـەڕێژن بە دوای ئەو هـەمووە جگەرگۆشە و خۆشەویستانەیانا کە یاسـای نەفامیی بە ناڕەوا دووریان ئەخاتەوە و سـەرنگونیان ئەکات ، بێ ئەوەی تاوانێکیان لە دەست دا کەوتبێ !!

بەڵێ ، دایکی زەید نەی ئەزانی کۆرپەی ئازیزی لـە کوێیە ؟ نەی ئەزانی ، ئایا زیندووە و بە تەمای بێ، وە یـا مردووە و دەستی لێ بشوا !

بەڵام هەژارە چی بکا ؟ بۆ کوێ بڕوا ؟ چی بکا لە بیابانی دوورگەی عەرەبیی و چۆن هـەواڵی بزانێ ؟ هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی خەو و خۆراسـی لا هەڵ گیرا بوو و فرمێسکی وشك نەئەبوویەوە ••

باوکیشی پیاوانە نەی‌ئەتوانی پێی بخاتـە ژێـری و بە هەموو لایەکا ئەسـووڕایەوە و هـەواڵی زەیدی

جگەرگۆشـــەی ئـەبرصی ٠٠ لـەگەڵ ئەم هـەموو ماندووبون و گەڕان و پرسیارانەدا ، ئەویش فرمێسکی وشـــك نەئـەبوویەوە ٠٠ جا هـەر کەسـێ بـەم تائی کردنەوەیەدا تێ‌پەڕی نەکردبێ ، نازانێ هـەواڵ نەزانینی کۆرپەی ئاوا چەند زەحمەتە ٠٠ داخۆ چەنـد کەس بەو مەراقەوە سەریان نابێتەوە و بەیەك گەیشتنی کەوتبێتە قیامەت؟ هەر کەسیش دڵی بداتێ بەش بە حاڵی خۆی هەناوی دێتە تێش !

حاریثە زۆر شوێن گەڕا ٠٠ زۆر ماندوو بوو ، تا لـە ماندووبوون و خەفەتخواردنیـا ئەم هـەڵبەستە دڵتەزێنە کاریگەرەی وت :

بكيتُ على زيدٍ ولم أدرِ ما فعلْ
أحيٌ فيرجى أم أتى دونَهُ الأجَلْ ؟

فواللهِ مـا أدري واني لسـائـلْ
أغالكَ بعدي السهلُ أم غالكَ الجبلْ

تُذكّرُنيهِ الشمسُ عند طلوعها
وتعرضُ ذكراهُ اذا غربُها أفلْ

سأعمل نص العيس في الأرض جاهداً
ولا أسأم التطواف أو تسأم الابل
حياتي ، أو تأتي على منيتي
فكل امرىء فان وان غره الأمل

حاریثه دەری ئەبڕێ کەوا زۆر گریاوه به شوێن زەیدا و سەرسام ماوه داخۆ ئایا زیندوو بێ یا کۆتایی بـه تەمەنی هاتووه ، داخۆ ئایا ئێستە لە کوێ بێ ؟ لـه دەشت ، له شاخ ؟ هەرچی خۆر هەڵ دێت ، چونکە زەیدی کۆرپەی خۆری ژیان و رۆشنایی چاوەکانی بووه ، ئەوی بیر ئەکەوێتەوه ، تا که ئاوا ئەبێ ، لـه بیری ئەچێتەوه .. ئینجا بڕیاری کۆڵنەدان ئەدا لـه گەڕان به شوێنیا و دەری ئەبڕێ یا ئەبێ زەیدی مایەی ژیانی دەست کەوێتەوه، یان لەو پێناوەدا تەمەنی تەواو کا و سەر بنێتەوه . خۆ دیاریشه هەموو کەسێ هـەر ئەبێ بمرێ ، بەڵام کوێر تا ماوه به تەمای دوو چاوی ساغه..

حاریشـــه دەری بڕینی چـۆن جگەری کڵپـەی

سەندووە بۆ کوڕەکەی و تا هەواڵی نەزانێ دڵی دانامرکێتەوە .. جا خۆ وە نەبێ تەنها جەرگی حاریثە بەم شێوەیە بڕڕا بێ.. هەموو رۆژێ لەم سەرزەوییەدا هەزارەها ، بەڵکو ملیۆنەها باوك ئا بەو شێوەیە بە دەست کاری ناهەمواری نەفامییەوە ئەناڵێنن .. کە سایە و سێبەری بەرنامەی قورئان دەست نەکەوت کەس ناحەسێتەوە !

بەم بۆنەوە پێویستە موسڵمانانی ئەم سەردەمەش چاك بزانن نەفامانی سەرزەویی بەوپەڕی بێویژدانیی و بێبەزەییەوە دژی ئیسلام و موسڵمانەکان وەستاون..
جا پێویستە بەم زانینە بڕیاری خۆیان یەکلایی بکەنەوە :

ئەگەر شوێنی ئیسلام بکەون ئەوەتا دژایەتیی و پلانی کافران لەوپەڕی پلەدایە ..

خۆ ئەگەر وازی لێ بێنن و ئالای نۆکەریی هەڵ کەن ، وە نەبێ دوژمن بێتە دۆست و دەستی

یارمەتیی و خۆشەویستیی بۆ جیهانی چەوساوە درێژ کا •• بەڵکو ئەبینین چەند صەدەیەکە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی جیهانی ئیسلامیی وان لە ژێر چنگی کافراندا و بە دوژمنایەتیی و وێرانکاریی بەو لاوە بە هیچی تر هەڵ نەساون •• هەموو مەبەستێکیان لەناوبرنی موسڵمانەکانە چ خۆیان و چ سامان و خێر و بێری وڵاتانیان •• رەنگە هەندێکیش بە خەیاڵی خۆیان ژیانیان وە دەست هێنابێ •• بەڵام داماوانە نازانن ژیانی نۆکەریی و چاوشۆریی و جاسووسیی و میللەتفرۆشتن ژیان نیە و رۆژ بە رۆژ گەلانی موسڵمان زیاتر پەشێوحاڵ ئەبن ••

کەواتە کافرانی سەرزەویی نیازیان ئەوەیە هەرچی رۆڵەی موسڵمان هەیە سەرگەردان و بێئەنجام بن و خاکی ئیسلامیش وێرانە بێت •• جا کە موسڵمانان ئەمەیان بۆ دەر کەوت کە : دوژمن هەر دوژمنە و نیازی گڵاوی دەرهەق بە موسڵمانان ناگۆڕێ ، چاك وایە هێزی خوای گەورە لە خۆیان نەکەن و پاڵی پێوە

بدەن و بۆ رزگارکردنی خۆیان و بەرەکانی دواوەیان، هەروەها بۆ رزگارکردنی ئادەمییەکانی تر ، دەست بگرن بە قورئانی پیرۆزەوە ، مەرگ بە مەردایەتیی چاکترە تا بە سەرشۆڕیی •• ئازایەتیی و گرتنی ڕێگای راست هێزی خوای لە گەڵایە و سەرکەوتنی هەردوو جیهان پاداشیەتی ، بەڵام نۆکەریی و چاوشۆڕیی و شوێن کەوتنی کافران ، خەشمی خوای بە دواوەیە و خەجاڵەتیی و ڕەنگ زەردیی هەردوو جیهان سزایەتی ••

# بەدیدار شادبوون

حاریثە و ژنەکەی و کەس‌وکاریان لە دووریی زەیدەوە ئەتلانەوە خەفەتی بێ‌ئەنجامیان ئەخوارد •• تا ئەوە بوو هەندێ لە پیاوانی هۆزەکەی زەید ، بە نیازی حەج‌کردنی سەردەمی نەفامییەوە ڕێیان کەوتە مەککە •• لە کاتێکا خەریکی تەوافی ماڵی پیرۆز بوون ، سەیریان کرد وا زەید هات بە پیریانەوە ، یەکتریان ناسییەوە •• دوای هەواڵپرسین و بەخێرهاتن بۆیان دەرکەوت زەید وا لە مەککەدا ••

دوای تەواوکردنی کاروباری حەج بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە و مژدەی چاوپێ‌کەوتنی زەیدیان دا بە باوکی ••

خۆشیی کەوتە دڵی حاریثەوە •• کەواتە زەیدی خۆشەویستی ماوە •• وا لە مەککەدا •• لە شاری پیرۆزدا •• لە پەنای کەعبەی پایەداردا ••

وای بە چاک زانی بە زووترین کات لەگەڵ

کەعبی برایا بکەونە رێ و خۆیان بگەیەننە زەید •• بۆ ئەمەش ئەوەندەی کە پێویست بوو پارە و سامانی لەگەڵ خۆیا هێنا تا هەر چۆنی کردووە زەید لە دیلی و بەندایەتیی رزگار کا ••

بە پەلە بەرەو مەککە کەوتنە رێ ••

ئای کە گەشتێکی خۆش و بە تام بوو • گەشتی بیابانی چۆڵ و بێئاو زۆر مەینەتە •• بەڵام ئەم گەشتەی حاریثە وەك گەشتەکانی تری نەبوو کە بە شوێن زەیدا ئەگەڕا ••

کە گەیشتە مەککە ، هەواڵیان زانیی زەید وا لە ماڵی پیاوێك بە ناوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا •• چوونە ماڵەوە لای پێیان وت :

ئەی کوڕی عەبدولموطەلیب ، ئێوە دراوسێی ماڵی خوان ، دیل رزگار ئەکەن و برسیی تێر ئەکەن و ئەگەنە فریای ستەملێکراو •• وا ئێمەش بە بۆنەی ئەو کوڕەمانەوە کە لاتانە هاتووینەتە خزمەتت و

چەندی پیوێست بێت پارەمان لەگەڵ خۆمان هێناوە ، جا پیاوەتییمان لەگەڵا بکە و بە هەر چەندێ بووە بەری بدە بۆمان ..

فەرمووی :

ئەو کوڕەی کە مەبەستانە ، کێیە ؟

وتیان : زەیدی خزمەتگوزارت ..

فەرمووی : ئەی شتێکی ترتان ناوێ لەوە چاکتر بێت ؟

وتیان : کامەیە ئەو شتە ؟

فەرمووی : من زەیدتان بۆ بانگ ئەکەم ، جا ئێوەیش پرسیاری لێ بکەن بزانن پێی خۆشە لای من بمێنێتەوە یان بێتەوە لەگەڵتانا .. خۆ ئەگەر ئێوەی هەڵ بژارد ئەوا بە بێ پارە پێشکەشتان بێت ، وە ئەگەر منیشی هەڵ بژارد ، منیش ئەو کاتە ، بە خوا ، هەرگیز دەست لە کەسێ هەڵ ناگرم کە منی هەڵ بژاردبێ ..

واتە : بەڵێ ئەو ئێستە بەندەی منە و ئەتوانم بێ پرسی خۆی بیفرۆشم ، بەڵام ئەو کە من هەڵ

بژێرێ هەرگیز دەست بەرداری نابم ••

خاوەنی دەروونی فراوان هەمیشە کری پیاوانەی لێ ئەوەشێتەوە •

ئەوانیش بەمە زۆر پێخۆشحاڵ بوون و رەزامەندیی خۆیانیان دەر بڕیی کە ئەمە ئەوپەڕی ویژدانە و لەم رێگایەیش چاکتر نیە !

موحەممەدی خۆشەویستمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ زەیدی بانگ کرد و فەرمووی : ئەمانە کێن ؟

وتی : ئەمە حاریثەی کوڕی شوراحیلی باوکمە و ئەمەش کەعبی مامەمە •

فەرمووی : خۆتم کردووە بە سەر پشك : ئەگەر بتەوێ ئەتوانی بڕۆیتەوە لەگەڵیانا ، وە ئەگەر بتەوێ ئەتوانی لای من بمێنیتەوە •

زەید ـ بە بێ هیچ وەستان و دوو دڵییەك ـ وتی: بەڵکو هەر لای جەنابت ئەمێنمەوە •

ئازیز و خۆشەویستم ئەی پێغەمبەری خـــوا ••

ئەی رۆشنایی چاوەکانمان •• ئەی پزیشك و دەرمانی دلەکانمان •• ئـەی فێنکیی و حەسانەوە و ساغیی لاشەکانمان •• رەوشتی بەرزت •• دەروونی فراوانت •• هەڵس و کەوتی پیاوانەت ، هەر کەسێ شارەزایان بێت ، ئەتوانێ لێت دوور کەوێتەوە ؟ تـا تۆی بەرێـز و خۆشەویست بۆ کەسێ دەست بدەیت و بتوانێ لـە خزمەتتا بمێنێتەوە ، کێ ئاوڕ بە لای دایـك و باوکی خۆیەوە ئەداتەوە ؟ هەموو دایك و باوکێ بە قوربانت بن ••

زەید خۆی شایانە وا ماڵەکەت هـەڵ بژێرراوە بۆی تـا گەشتی زەمینیی بە سەری بەرزەوە تەواو کا و قیامەتیشی مسۆگەر کا ••

زەید خۆی خوایێداوە ، وا رێی لە ماڵەکـەت کەوتووە ئەی سەرداری مـرۆڤایەتیی •• ئیتر چـۆن دڵی تاقەت ئەگرێ بە جێت بێڵێ ؟ چۆن ئـەتوانێ بـێ تۆ بژی ؟ چۆن بەرگە ئەگرێ ژیانی لە خزمەتتا تەواو نەکا ؟

خۆزگەم بە زەید وارێی لە تۆی بەڕێز و
خۆشەویست کەوت .. چی بکا لە دایك و باوکێ
نەزانن بۆ قیامەت پەروەردەی کەن و نەزانن هەڵس و
کەوت و رەفتاری بەرز و پیرۆزی پیشان دەن ؟
بەڵێ ، زەید بڕیاری دا لە ماڵی موحەممەدی
ئازیزی دەر نەچێت ..
باوکی و مامەی سەرسام بوون .. زەید بۆچی
وای بە سەر هاتووە ؟ باوکی بە سەرسوڕمانەوە پرسیی:
تیاچیت زەید ، ئایا بەندایەتیی و خزمەت کارییت بە
لاوە چاکترە تا بگەڕێیتەوە ماڵەوە لای باوك و دایکت ؟!
وەڵامی دایەوە : من ئەوەندەم بەم پیاوەوە بینیوە،
هەرگیز دەستبەرداری نابم و لێی جیا نابمەوە ..
تێی گەیاندن : ئەم کە لەم ماڵەدا ئەژیی ، بەندە
و خزمەتگوزار نیە .. نازی هەیە .. خۆشیی و
کامەرانیی تەواوی دەست کەوتووە ..
رەفتاری شیرینی موحەممەد وەها دڵیان راکێشاوە
هەرگیز ناتوانێ بە جێی بێڵێ .

زەید زۆر خۆشەویست بوو بە لای پێغەمبەرەوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ •• خاوەنی رێز بوو ، بەڵام کە ئەمەیشی دەربڕی ئیتر یەکجار خۆشەویست و بەڕێز بوو ، بۆیە هێشتا باوکی و مامەی مەککەیان بە جێ نەهێشتبوو ، پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ دەستی گرت و بردی بۆ لای کەعبە و لە پاڵی حیجردا وەستاندی و بە دیار کۆمەڵێ قورەیشییەوە جاڕی دا و هەرەوەی :

ئەی کۆمەڵی قورەیش ، بە شاهید بن ئەمە کوڕمە کەلەپوورم ئەبا و کەلەپووری ئەبەم ••

بەم شێوەیە بڕیاری دا هەرگیز دەستبەرداری زەید نەبێت کوڕیەتی و مەرجی کوڕایەتیی لە ـەلا بە کار بێنێ ••

باوك و مامەی زەید بە چاوی خۆیان ئەمەیان بە زەیدەوە بینی •• زۆر شادمان بوون بەو پایە و پلە بەرزەی کە زەیدی کوڕیان پێی گەیشتووە •• بەو رێزەی کە زەید لە لای موحەممەد بە دەستی هێناوە ••

بۆیه به دڵی خۆش و شادمانەوه و بەوپەڕی بێخەمییەوه لـه مەککه لای موحەممەدی دەروون پاك به جێیان هێشت و بەرەو ناوچەی خۆیان گەڕانەوه ..

حاریثه بەم شێوەیه گەڕایەوه ، بەڵام دوای بێخەم بوون لـه حاڵ و وەزعی زەید و ئۆخەی کرد که قوڵاخی جگەر گۆشەکەی به چاكترین شێوه کردوه .

ئیتر لەو رۆژەوه ناوی زەیدی کـوڕی حاریثـه گۆڕا و خەڵکیی به ناوی زەیدی کوڕی موحەممەدەوه بانگیان لێ ئەکـرد .. تا ئەوه بوو پێغـەمبەری خـوا ـ صـلی اللـه علیـه وسـلم ـ وەحی بۆ هـات و دوای کۆچ کردن بۆ مەدینه ، فەرمانی درا به سەرا دەست لـه یاسای بەکوڕ کردن هەڵ بگرێ و هەموو کەسێ به ناوی باوکی خۆیەوه بانگی لێ بکرێ و کەسی تر نەی کا بـه کوڕی خۆی ، چونکه پەیوەندیی باوك و فرزەندایەتیی پـەیوەندیی خوێن و پشـته و ئـەو کوڕه بەشـێکه و پـارچەیەکه له باوکەکەی . جا بـه دەم بەکوڕ کـردن راست نیـه و ئەو پەیوەندییه دروست نابێت ، خـوای

گەورەش هەمیشە راستیی ئەفەرموێ و تەنها خۆی هیدایەتدەرە بۆ دۆزینەوەی رێگای راست و رەوان ..
ئەو رێگایەی کە نەهێڵێ مرۆڤ لە یاسای بوونەوەر بپچڕێ تا سەرگەردان و سەر لێ شێواو نەبێت .. بەڵێ ، خوای گەورە وا بە چاك ئەزانێ و ئەوەی بە لاوە دادپەروەرییە کەوا هەموو کوڕێ بە ناوی باوکی خۆیەوە بانگی لێ بکرێ ، تا باوك و فرزەند لە یەکتریی نەپچڕێن و ئەو کوڕە لە کەلەپووری باوکی خۆی بێبەش نەبێ و لە هەمان کاتا پەیوەندیی ئەندامانی خێزان نەپچڕێ و خێزانەکان لە رووخان و تیاچوون پارێزراو بن ؟ چونکە هەر کۆمەڵێ پارێزگاریی پایەی خێزانی نەکرد ، ئەو کۆمەڵە رۆژ بە رۆژ بەرەو لاوازیی و تیاچوون هەنگاو هەڵ ئەگرێت .. بەڵام خۆ ئەگەر هەندێ کەس هەبوون و باوکیان نەئەناسرا ئەوا با کۆمەڵی موسڵمان بە برای ئایینی و بەندە و خزمەتگوزار بانگیان لێ بکەن .. ئەوەتا قورئانی

پیرۆز لەو بارەوە ئەفەرموێ :

وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ﴿٤﴾ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ ﴿٥﴾ الأحزاب

ئیتر ئەوە بوو خەڵکیی وازی لە ناوی زەیدی کوڕی موحەممەد هێنا و لە سەر فەرمانی قورئان بە ناوی باوکی خۆیەوە بانگیان لێ ئەکرد ..

# خۆشەویستیی راستەقینە

زەیدی دڵپاك ، کاتێ کە دەستی لە دایك و باوکی خۆی هەڵ گرت و خەدیجە و موحەممەدی کردنە دایك و باوك ، نەی ئەزانی تا چ ئەندازەیەك بەختەوەریی هەر دوو جیهانی دەست کەوتوە ..

نەی ئەزانی چ بەخششێکی گەورەی پێ بەخشراوە .

نەی ئەزانی ئەو پیاوە بەڕێز و خۆشەویستەی کە ئەو هەڵی بژاردووە و بڕیاری داوە لە گەڵیا بژی و لە بەر خاتری خۆشەویستیی ئەو و نزیکیی لێیەوە دەستی لە هەموو کەس و کار و خزم و عەشرەتێکی هەڵ گرتووە، گەورە و سەرداری هەموو گرۆی ئادەمییە و ئەبێتە هەڵبژاردە و نێرراوی خوای گەورە بۆ سەر هەموو جیهان ..

نەی ئەزانی ئەو ماڵەی کە ئەو بە جوانیی دڵی جۆتە سەر گوفتی شیرین و کرداری چاکی ، ئەبێتە تاقە مەڵبەندی بەخشان کردنی نوور و رۆشنایی تا

مرۆڤایەتیی لە تاریکیی دەربێنێ ..

نەی ئەزانی و نەخورپا بووە دڵیەوە لە دوا رۆژا دەوڵەتی داد و یەکسانیی ، بە فەرمانی ئاسمان ، لە سەر زەویدا پایە دا ئەکوتێ و بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا پەرۆباڵ بڵاو ئەکاتەوە ، تا ستەم و ناڕەوایی لـە ریشکا دەر بێنێ و داد و یەکسانیی و برایەتیی و خۆشەویستیی لـە جێگەیا بڕوێنێ ..

هەرگیز بیری لەوە نەئەکردەوە یاسای خوایی بێتـە سەر زەویی و ئاڵو گۆڕێکی بنەڕەتیی لـە ژیانـی مرۆڤدا روو بدات و ئادەمیزاد ـ بە تەواوەتیی و بە پیاو و ئافرەت و ئازاد و بەندەوە ـ رزگار بکرێت ..

وە نەیئەزانی ئەوی بەندە و خزمەتکاری ماڵان و فرۆشراوی بازاری عوکاظ ، یەکـەم پیـاوێ ئـەبێ شوێنی رێبازی خوا بکەوێ و ئەبێتە یەکەم خشت لـە کۆشکی دەوڵەتی پڕ لە داد و یەکسانیی ئیسلامدا[1] ..

---

(١) بەڵێ ئەبوبەکر ـ خوا لێی رازیی بێت ـ بە یەکەم

نەی ئەزانی ئەو پیاوەی کە مافەکای ژیانی زەوت کراون و کراوەتە بەندە و کۆیلە ، وە ئەو ئافرەتەی کە لە سەر زەویدا هیچ مافێکی بۆ دیاریی نەکرا بوو ، بە هەردوو کیانەوە یەکەم جار و پێش هەموو کەسێ ئیمان بە موحەممەدی سەردار و هەڵبژاردە و پێغەمبەری خوا ئەهێنن و ئەبنە پاڵپشتی رێگای راست بۆ بنیاتنانی دەوڵەتی قورئان ، دەوڵەتی سایە و سێبەر بۆ ئادەمیزاد، بە پیاو و ئافرەت و ئازاد و بەندە و هەژار و دەوڵەمەندەوە ..

بەڵێ ، زەید ئەمانەی نەئەزانی ، بەلام سۆزی خوا رژا بە سەر کەسێکا ئاوا بە لێشاو ئەی گرێتەوە

---

پیاوی موسڵمان ئەژمێررێ ، ئەمە لە چاو پیاوە ئازادەکانایە ، بەلام ئەگەر بەندایەتیی و ئازادیی بخەینە ئەو لاوە ، ئەوا زەید لە پێشەوە موسڵمان بووە ، خۆ ئەگەر ئافرەت و پیاویش بخەینە ئەو لاوە ، ئەوا خەدیجە ـ خوا لێی رازیی بێت ـ یەکەم ئادەمییەکە بڕوای بە پێغەمبەری پێشەوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ هێنا بێت ..

لـه بیابانێکی دوورەوە ئەیهێنن تا بگاتە ئەو ماڵەی کـە شـایانە تیایا پەروەردە بێ و دڵە پاکەکەی و ویژدانـە بزاوەکەی تیا بحەسێتەوە تا بەو دەورە گرنگە هەڵسێ کە لـە ترازووی خوادا بۆی نەخشە کێشراوە •• وە تـا هەموو مرۆڤایەتیی بزانێ ئیسلامی بێگەرد مێشکی ساف و بیری تیژ و دڵی پاك و مەبەست و نیازی پیرۆز لێك ئەداتەوە و بەو ترازووەش کێشانەی ئادەمییەکان ئەکات و پلە و پایەیان بۆ دا ئەنێ ، نەك بە هیچ کێشانە و پێوانەیەکی تر ••

بەم شێوەیە زەیدی خۆشەویست لە باوك و دایکی وازی هێنا و دوای چەند ساڵێك وەحی ، لە ئاسمانەوە هاتە سەر پێغەمبەری نازدار ـ صلی الله علیه وسلم ـ •• رێبازی چاکویستان کەوتە کۆڕی ژیانەوە •• مرۆڤـی مەرد و قارەمانی ئەویست هەڵی گرێ • مرۆڤی دەست و دەم و دڵ و دەروون پاکی ئەویست پێشکەشی بکا بـە مرۆڤایەتیی سەرگەردان و سەرلێشێواو ••

پێش هەموو کەس زەید هەڵمەتی دا •• ئیمانی هێنا •• دڵی سپی و پاك و خاوێنی پڕ کرد لە ئیمان •• لە رۆشنایی ئاینی بێ گەرد •• دە با ملهوڕان چی ئەکەن بی کەن ، رێبازی خوا هەرچی کەسێ بەکەڵك و لێهاتوو بێ رای ئەکێشێ •• پەروەردەی ئەکات •• مێشکی زاخاو ئەدات ••

ئای کە سەربەرزیی بوو زەید دەستی نا بە رووی باوك و مامەیەوە و دەستی شۆریی لە هەموو کەس و کارێکی و کۆمەڵی ئیمانداری کردە کەس و کار و پشت و کۆمەکی خۆی ••

زەید دیار بوو لێهاتوو و زیرەك و ئازا و گورج و گۆڵ بوو •• بەوپەڕی متمانەوە ئیمانی هێنا •• ئیمانی هێنا بەو بەرنامە شیرینەی کە هاتبوویە سەر موحەممەدی سەردار و خۆشەویستی •• هەر تەنها ئەوەندە بەس بوو بۆ باوەڕکردن بەو رێبازە شیرینەی کە موحەممەدی راستگۆ و خاوەن سپاردە بڵاوی ئەکردەوە ••

زەید بووە جێی متمانەی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ و ئاگاداری نهێنییـەکانـی بوو ، وە چەند جار بوو بووە سەرکردەی لەشکر و نێرراوەکانی، وە یەکێ بوو لەو پیاوە لێهاتووە متمانەپێکراوانەی لە پێغـەمبەری خـوا ـ صلی اللـه علیه وسـلم ـ ، دوای دەرچوونی لە مەدینە ، کاروباری شاری پێ ئەسپاردن ..
دیارە ئەمانەش ئـەوپەڕی راسـتی و پاکیی و لێهاتی زەید دەر ئەخەن ..

جا هەروەك زەید پێغەمبەری خوای ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ پڕ بە دڵ خۆش ئەویست و لە بەر خاتری ئەو دەستی لە دایك و باوك و کەس و کاری هەڵ گرت، هەروەها پێغەمبەریش ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئـەوی زۆر خۆش ئەویست و لە کرۆکی دڵیا جێی کردبۆوە، بـە رادەیـەك تێکەڵ بە مـاڵ و منداڵـی بوو .. هیـچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ مناڵەکانیا .. هەر کاتێ دیار نەبوایە بێتاقەتی ئەبوو ، وە بە گەڕانەوەی دڵخۆش و شادمان ئەبوو ، وە بە شێوەیەك پێشوازیی لێ ئەکرد و

پێی ئەگەیشت کەسی تر نەئەگەیشتە ئەو پلەیە ..

ئەوەتا خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران ـ خوا لێی رازیی بێت ـ بۆ نموونە بۆمان ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ چەندە زەیدی بە لاوە بەڕێز بووە و چەندە پێ خۆش حاڵ بووە پێی بگات: زەیدی کوڕی حاریثە گەڕایەوە بۆ مەدینە و پێغەمبەری خوایش ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە ماڵی منا بوو ، زەید تەقەی دا لە دەرگا و پێغەمبەریش ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە رووتیی هەڵسایەوە بۆ لای کە جگە لەوەندەی کە نێوان ناوك و ئەژنۆی داپۆشێ بەرگی تری لە بەرا نەبوو ، بەرە و دەرگا رۆیشت و کراسەکەی بە شوێنیا را ئەکێشا ، باوەشی پیا کرد و ماچی کرد ، دە بە خوا نە لەوە و پێش وە نە لەوە و پاش پێغەمبەری خوام ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە رووتیی نەبینیوە ..

ئەمە ئەوپەڕی رێز و خۆشویستن دەر ئەخات بۆ زەید ، بەڵام نەك هەر ئەمە بەڵکو ئەوەندە دەنگ

و باسی خۆش‌ویستنی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلمـ
بۆ زەید بڵاو بوو بە ناو موسـڵمانەکانا ، ناویان نا بوو
« زیـد الحب ، زەیـدی خۆشـــەویست » وە نازناوی
« حب رسول الله » یان پێوە نا بوو ، هەروەك ئوسامەی
کوڕیشی نازناوی « حب رسول الله و ابن حبه » پێــوە
نرا بوو ..

مرۆڤ کە دڵەکەی بە تەواوەتیی خاڵیی کرد لـە
هەموو خۆشەویستییەك و پڕی کرد لە خۆشەویستیی
باڵفتەی خوا و پێغەمبەرەکەی ئاوەها پایەدار ئەبێت ..
بـەو جۆرە سەنگین و قورس ئەبێت ..

# دەست درێژیی ناڕەوا

ماوەی مەککە بە دەرد و مەینەت و ئێش و ئازاریەوە ، بە کۆمەکیی خوا ، لە موسڵمانەکان ڕۆیشت و کۆچیان کرد بۆ مەدینە و دەوڵەتی قورئانیان بەرپا کرد .. بەڵام لە هەموو لاوە خوانەناسان ڕم و شیریان بەرز کردەوە بۆ تۆقاندن و لەناوبردنی موسڵمانەکان..
بە تایبەتیی تا ساڵی پێنجەمی کۆچیی موسڵمانەکان بە سێ دوژمنی سەرەکیی ناو دەوروبەرەوە پەشۆکا بوون :
یەکەم : قورەیش لە لای باشوورەوە . دووەم غەطەفان و هۆزە بڕەترسییەکانی نەجد کە پێوەی ئاڵا بوون لە لای خۆرهەڵاتەوە . وە سێیەم جوولەکەی خەیبەر لە باکووری خۆرهەڵاتەوە .
بەڵام دوای سەرکەوتنە مێژووییەکەی خەندەق ، کە ئەوپەڕی ئیمانداماوەزاویی و دانبەخۆداگرتن و کۆڵنەدان و لێبڕانی سەربازگەی ئیسلامیی دەرخست،

پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەستی کرد، هەروەها دوژمنەکانیش هەستیان کرد ، کەوا ئیسلام سوپاس بۆ خوا ـ وا بە قووڵیی لە خاکی دوورگەدا ریشەی داکوتێ ، وە ئیتر لەمەولا لەشکری ئیسلام لە هیچ هێزێك سڵ ناکاتەوە و تازە لە توانای هیچ هێزێکا نیە لە بەردەم موسڵمانەکانا خۆی بگرێ .. تا ئەوە بوو پەیمانی حودەیبییەش لەگەڵ قورەیشا بەسترا ..

پەیمانی حودەیبیە سەرکەوتنێکی سیاسیی گەورە بوو بۆ موسڵمانەکان کە ئەمە هەندێك لە بەرهەمەکانیەتی :

١ ـ دانپێنان بوو لە لایەن قورەیشەوە بە بوونی سیاسیی موسڵمانەکان کە ئەمە یەکەم جار بوو قورەیشی یەکەم و گەورەترین دوژمن بەم کارە هەڵسێ .. چونکە قورەیش لەوە و پێش وای دا ئەنا موسڵمانەکان دەستەیەکن لە فەرمانی قورەیش یاخیی بوون .

٢ ـ ماوە درا بە موسڵمانەکان تا پەیمان لەگەڵ

چەند هۆزێکدا ببەستن کە لەوە و پێش ئەو هۆزانە لە ترسی قورەیش نەیان ئەوێرا بەو کارە هەڵسن ..
ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوونی موسـڵمانەکان و کەم بوونەوەی دوژمنەکانیان .

٣ ـ تێکدانی یەکێتیی قورەیش و جوولەکە هاوپەیمانەکانی لە خەیبەر کە هەمیشە خەریکی هەڵنانی عەرەبە بتپەرستەکان بوون دژی موسڵمانەکان .

٤ ـ دامەزراویەکی بەخشیی بە موسڵمانەکان تا ماوەی گەیاندنی ئیسلامیان هەبێ .

٥ ـ خەڵکیی ستەمکاریی و لاریی قورەیشیان بینی کە دژی کۆمەڵێکی ئاشتییخواز وەستاوە ، کە نیازی رێزگرتنی ماڵی خوایان هەیە !

٦ ـ پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئاوڕی دایەوە بە لای پاشا و ئەمیرەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە ، تا دەنگی راستیان بە گوێدا بدا و بانگیان

کا بۆ سەر ڕێبازی ئیسلام و لە دەوری هێزی بەرەسەندووی ئیسلام جەم بن و بە خزمەتکردنی ئایینی خوا لە هەردوو ژیاندا بەهرەمەند بن .

٧ ـ لە هەمان کاتا و پێش هەموو شتێك پێغەمبەری سەرکردە ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەڵمەتی شێرانەی بردە سەر هێزی شێرپەنجەی جوولەکەی خەیبەر ، تا دەستکۆتایان بکا لە دژایەتیی ئایینی خوا و کۆمەڵی ئیماندار ، کە ئەوان لە هەموو کەس زیاتر لە ڕاستیی ئەم ئاینە بێگەردە شارەزا بوون و ئەبوایە پێش هەموانیش ئیمانیان بێنایە ..

٨ ـ ئاوڕدانەوەیەك بە لای دەوڵەتی ڕۆمانیی پڕمەترسییەوە و ئامۆژگارییەکی کرداریی بکرێت تا تاوس ئاسایی خۆی کیف نەکا و نەنازێ بە دەوڵەتی بەهێز و لەشکری زۆر و زەبەندەیدا و با چاك بزانێ لەشکری ئیسلامیی کەم و کەم تفاق خوای لە گەڵە و بە هێزی ئیمان جەنگ ئەکا و لە پێناوی ئیسلامدا مردنی

زیاتر لا مەبەستە تا ژیان ، لە بەر ئەوە هێز نیە چاری بـکا ..

ئەمەش دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیە وسلم ـ بە شێوەیەکی ئاشتیی‌خوازانـە و بەوپەڕی ڕێزەوە نامەی نارد بۆ پاشا و میران تا لە بانگی خـوا ، بە خۆیان و گەلەکانیانەوە ، ئاگادار بکرێن و شەرمەزاریی قیامەتیان بە سەرا نەیێ و موسڵمان بن وە یـا ئەگـەر نەبوون بیانوویان نەمێنێ .

ئەوە بوو لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی سای هەشتەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـە علیـە وسـلم ـ کەعبی کوڕی عومەیری ئەزدیی لەگـەڵ چـوارده موسڵمانی ترا بەرەو غوور نارد تا گەیشتنە «ذات اطلاح» لـە خاکی شام ، کە ماوەی شەش‌صەد میل زیاتر ئەبوو و ئەکەوتە بولقاء کەوا حاریثی کوڕی ئەبووشەمەری غەسسـانیی بـە نـاوی ئیمپـراتۆریەتی ڕۆمانییـەوە فەرمانڕەوایی ئەکرد .. ئەوەی کە زیاتر دێتە بەر بیر

ئەركی سەرشانی ئەم دەستە موسڵمانە بڵاوكردنەوە و گەیاندنی ئیسلام بوو ، بە شێوەیەكی ئاشتیی‌خوازانە ، بەو مەرجەی خۆیان بگەیەننە خاكی شام •• چونكە دیارە ئاگادار كردنی ئادەمییەكان لە ئایینی پاكی خوا ، ئەركی سەرشانی هەموو موسڵمانێكە ، ئەگەرچی هەموو جۆرە سزا و مەینەت و چەرمەسەرییەكی بێتە بەر دەم ••

كاتێ دەستە موسڵمانەكە گەیشتنە ئەوێ ، كۆمەڵێكی زۆر لە عەرەبە گاورەكانی غەسسانیە ـ كە هەموویان ئەسپ‌سوار بوون ـ هەڵمەتیان بۆ هێنان و لە ناخلۆفا دایان بە سەریانا •• هاوەڵان ناچار بوون بەرگریی لە خۆیان بكەن و بچن بە گژیانا ، تا سەرەنجام چواردەیان بە شەهیدیی سەریان نایەوە و جگە لە زامدارێكیان ، كە لە كاتی تاریكیی شەودا خۆی رزگار كرد و بە هەرحاڵ بە زامەكەیەوە خۆی گەیاندەوە مەدینە و هەواڵەكەی دا بە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ، كەسیان دەر نەچوو • ئەمەش لە

وەلامی ئەو بانگە بێگەردەدا کە بانگیان کردن بۆ لای خوا و باوەڕهێنان بە ڕۆژی زیندووبوونەوە •

کاتێ پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەم هەواڵەی بیست زۆری پێ ناخۆش بوو ، بۆیە بڕیاری دا هێزێك لە هاوەڵان دروست بکا و تەمێی ئەو هۆزانەی پێ بکا ، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو هەواڵی پێ گەیشت ئەو نەفامانە لەو ناوچەیە نەماون و گواستوویانەتەوە بۆ شوێنێکی تر ، بۆیە وازی لە بڕیارەکەی هێنا ••

وتمان : پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئاوڕی دایەوە بە لای پاشا و ئەمیرەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە ، تا دەنگی راستیان بە گوێدا بدا و بانگیان بکا بۆ سەر ئیسلام •

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە سەرەتای ساڵی هەشتەمی کۆچییدا چەند هاوەڵێکی هەڵبژارد بۆ هەرگرتن و گەیاندنی نامەکانی بەو

پاشـــایانە ، لـــە کاتێکا کە نامەکان نامـــەی ئاشتیی و بانگ کردن بوون ، دوور لـە هەڕەشە و ترساندن بـە جەنگ و هێرش ••

یەکێ لەو نێرراوانە حاریثی کوڕی عومـــەیری ئـەزدیی بوو کە نامەیـەکی دایـێ بۆ پاشـای بوصرا و جەولان ، حاریثی کوڕی ئەبووشومەری غەسسانیی•• ڕۆیشت هەتا گەیشتە دێی موئتە لە بولقاء شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسسانیی تووش بوو ، کە یەکێ بوو لەوانەی کاروباری پاشا حاریثیان هەڵئەسووڕاند •

شورەحبیل لە هەڵگری نامەی پرسیی :

— بۆ کوێ ئەڕۆی ؟

+ بۆ شام ••

— لەوانەیە لە نێرراوانی موحەممەد بیت ••

+ بەڵێ •

لـە سەر ئەمە توند دەست و پێی بەست و ئینجـا دای لـە گەردنی و شەهیدی کرد ••

ئەمە یەکەمجار بوو نێرراوی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بکوژرێ ، لە بەر ئەمە کاتێ کە بیستی بە لایەوە زۆر گران بوو ..

لـە پاڵ ئەم دەستدرێژیيانەدا پاشای غەسسانیی ، حاریثی کوڕی ئەبووشومەر ، کەوتە هەڕەشەکردن ، گوایا نیازی وایە لەشکر بە رێ بکا و هەڵمەت بەرێتـە سـەر پایتـەختی ئیسـلام ؟ ئەمەش لە کاتێکا بوو کـە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ شەجاعی کوڕی وەهبی ئەسەدیی هاوەڵی بە نامەیەکەوە نارد تا حاریث ئاگادار کات ..

کە نامەکەی خوێندەوە ، وتی : کێ ئەتوانێ موڵك و دەسەلاتم لێ بسێنێ ، من ئەچمە سەر ئەو ، ئەگەرچی لە یەمەنیش بێت،بەلام ئەوە بوو قەیصەر رازیی نەبوو .

# عیرەتی پێشەوا

پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ عیرەتی قبووڵی نەئەکرد دوژمن دەستدرێژیی بکاتە سەر موسڵمانەکان ، لە هەمان کاتا حەزی نەئەکرد کوفر لەشکر بە رێ بخا و بەرەو پایتەختی ئیسلام بکەوێتە رێ ، چونکە لەشکری ئیسلام کاتێ کە گەمارۆ بدرێ توانای جەنگی نامێنێ و دوژمن بە ئاسانیی زاڵ ئەبێ بە سەریا ..

بۆیە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەبەر ئەمە و لە بەر هەر دانایییەتیەک کە لە دڵیا بوو بێ ، بڕیاری دا لە شکرێك بە رێ بخا و بە شێوەی هەڵمەتێکی سەربازیی گەورە ، هێرش بکاتە سەر خاکی شام تا دەرسێکی چاکی ئەو عەرەبە بەگاوربووانە دا بدا کە بوونەتە نۆکەری رۆمی گاوری ستەمکار و حاڵ و میللەتیان خستۆتە ژێر پێیەوە .. وە تا لە شکری موسڵمانەکان بە شێوەی « کرداریی » بیسەلمێنێ بۆ رۆمانەکان کە خاکی ئیسلام زۆر لەوە بەهێزتر و

سەختترە کە دوژمنی کافر بیر لە هێرش کردن بکاتەوە بۆ سەری و پێ بنێتە خاکی « لا الە الا اللە » وە .

جا بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستە پیرۆزە ـ مەبەستی پاراستنی سایە و سێبەری بەرنامەی « لا الە الا اللـە » ، تـا مرۆڤایـەتیی پێی بحـەسێتـەوە ـ پێغـەمبـەری خۆشەویستمان ـ صلی اللە علیە وسلم ـ سێهەزاری لـە چاکترین و تێ گەیشتووترین هاوەڵەکانی هەڵبژارد .. سێهەزار لەو ئیماندارانەی کە بەم فەرموودەیەی تێی گەیاندبوون : کە هەر موسلمانێ بە بەرووەر اریتیی خوای گەورە و ئاینی ئیسلام و پێغەمبەریتیی موحەممەد ـ صلی اللـە علیـە وسـلم ـ رازیی بێت ، بەهـەشـتی مسۆگەرە ، جا ئەوە بوو ئەبوو سەعیدی خودریی ـ خوا لێی رازیی بێت ـ سەری لەم فەرموودەیە سـوڕ ما و داوای کـرد دووبارە بۆی بڵێتەوە ، کـە بۆی دووبـارە کردەوە ، تێی گەیاند کە کـردەوەیەکی تری چاکیش هـەیە ، خوای گـەورە صـەد پلە ئیمانداری پێ بەرز ئەکاتەوە لە بەهەشتا و نێـوان هـەموو دوو پلەیەك وەك

نێوانی ئاسمان و زەویی وایە • نەبووسەعیدیش خێـرا هەواڵی ئەو کردەوە چاکەی پرسیی • فەرمووی : جیهادە لە پێناوی خوادا ، جیهادە لە پێناوی خوادا :

**عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : « من رضي بالله رباً ، وبالاسلام دينا ، وبمحمد رسولا ، وجبت له الجنة » • فعجب لها أبو سعيد ، فقال : أعدها علي يا رسول الله ، فاعادها عليه ، ثم قال : « وأخرى يرفع الله بها العبد مائة درجـة في الجنـة ، ما بين كل درجتين كمـا بين السماء والارض » • قال : وما هي يا رسول الله ؟ قال : « الجهاد في سبيل الله ، الجهاد في سبيل الله » • رواه مسلم •**

لەشکری چـاکویسـت کۆکرایـەوە •• بـەڵام موسڵمانەکان نەیان ئەزانی بەرە و کوێ ئەڕۆن ، تا لـە شار دەرچوون و جورفیان کردە سەربازگە ، کە چەند میلێك لە مەدینەوە دوور بوو • ئینجا لەوێ ئاگاداری کردن پێویستە سنووری دوورگە ببڕن و بچنە خاکی

شامەوە و بچن بە گژ ئەو دوژمنانەدا ، کە بە ناڕەوا خوێنی موسڵمانەکانیان ڕێژا •

هەر لەو شوێنەدا پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرماندەی گشتیی بۆ لەشکر هەڵبژارد: زەیدی کوڕی حاریثە سەرکردەی لەشکر بێت ، ئەگەر ئەو شەهید کرا ، جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ، وە ئەگەر ئەویش شەهید کرا ، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ، خۆ ئەگەر ئەویش شەهید کرا ، ئەوا با موسڵمانەکان و پیاوماقوڵانی هۆزەکان کۆ بکەنەوە و بە پێی یاسای شوورای ئیسلامیی کێ بە چاك ئەزانن هەڵی بژێرن و بیکەنە فەرماندەی خۆیان ••

لەو کاتەدا کە لەشکر لە جورف دا وەستا بوو ، موسڵمانەکان هاتن بۆ بەڕێکردن و خواحافیزیی • پێغەمبەری خوایش ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئاڵایەکی سپیی ئامادە کرد بۆ فەرماندەی لەشکر •

بەم شێوەیە سێ هەزار سەربازی جەنگاوەری

بەغیرەتی ئیسلام مەدینەی پایتەختیان بەجێ هێشت ، کە ئەمە یەکەم لەشکرێ بوو تا ئەو کاتە بۆ پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - کۆ بێتەوە و لەژێر دەستی یەك فەرماندەدا بێت ..

لە رۆژی جومعەی مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمدا لەشکری چاكویست کەوتە رێ .. بەرەو شام .. بۆ جیهاد .. بۆ بەرزکردنەوەی بانگی خواپەرستیی .. بۆ رۆشن کردنەوەی سەرزەویی بە رۆشنایی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ، موسڵمانەکان کەوتنە رێ..

کەوتنە رێ ، دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - مەبەستی جەنگی ئیسلامیی پیشان دا بوون ، تا جەنگی ئیسلامیی جیا بێت لە جەنگی نەفامیی ..

ئەوە بوو ئەو جارەش وەك هەموو جارێکی تر ئامۆژگاریی کردن تا بە ناوی خواوە و بە پشتیوانیی خوا و لە پێناوی خوادا و لە سەر رێڕەوی ئوممەتی پێغەمبەری خوا بکەونە رێ . بێ پرسی ئەمیر دەست

نەبەن بۆ دەست کەوتی جەنگ ، ناپاکیی نەکەن ، لووت و گوێی کوژراوانی دوژمن نەکەن ، منال و ژن و پیری بە سالا چوو نەکوژن،وەك لە روانگەی ئەم فەرموودەیەوە بۆمان دەرئەکەوێ :

**كان ـ صلى الله عليه وسلم ـ اذا بعث سرية قال : « بسم الله وبالله وفي سبيل الله وعلى ملة رسول الله ، لا تغلوا ولا تغدروا ولا تمثلوا ولا تقتلوا وليداً ولا امرأة ولا شيخا كبيرا » .**

**رواه أبو داود والطبراني**

سەرکردەکانی لەشکری موسلمانەکان هەر بە شێوەی پێغەمبەر ، هەولیان دا دوژمنان لەم هێرشەیان ئاگادار نەبن ، تا لە ناخلۆفا بدەن بە سەریانا ، بەلام جوولەکە و دەستەی موونافیق خێرا هەوالەکەیان گەیاندبوو تا رۆمەکان ئاگاداری خۆیان بن ..

دلە رەشەکەیان خۆی پێ نەئەگیرا ، ئەگەڕان لە هەموو ساتێکدا پاگاندە بۆ موسلمانەکان بکەن و وورەی دوژمنەکانیان بەرز کەنەوە ..

# دەریای فراوانو دوورگەی بچکۆلە

یەکەم کەسێ ـ کە لـە جاسووسەکانی ڕۆمانەوە ، ئەوانەی لە مەدینەدا ئیشیان ئەکرد ـ هەواڵی هێرشـی موسـڵمانەکانی زانی ؛ شـورەحبیلی کـوڕی عـەمری غەسسانیی بوو ، کە کار هەڵسووڕێنەری ڕۆمەکان بوو لـە سەر ناوچەکانی باشووری شام کە هاوسنوور بوون لەگەڵ دوورگەدا •• ئەوەی حاریثی کوڕی عومەیری ئەزدیی ـ نێرراوی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ بۆ لای پاشای بوصرا و جەولان ـ کوشت •

بە پەلە هـەواڵی هێرشـەکەی دا بـە ڕۆمەکان و خۆیشی دەستی کرد بە کۆکردنەوەی لەشکر لە هۆزە عەرەبە نۆکەرەکانی ڕۆم ، لە هەمان کاتا سدووسی برای لەگەڵ چـەند پیاوێکیا نارد تا هەواڵی موسـڵمانەکان بزانن •

لەشکری موسڵمانەکان بەرەو ژوور لە سەر رەوتی خۆی بەردەوام بوو هەتـا گەیشــتە « وادي القرى » و لەوێ چەند رۆژێ حەسایەوە و دیسان کەوتەوە رێ •

لە رێگادا پێشەنگی لەشکری موسڵمانەکان تووشی دەستەکەی سدووس بوون و هەر لە ناو خاکی دوورگەدا کەوتنە جەنگ و لــە ئەنجاما ســدووس کوژرا • بەمە شورەحبیلی برای ترسـێکی زۆری لێ نیشمـت و دادی بردە بەر سەرکردایەتیی بالآی رۆمەکان ـ کە لەو کاتەدا لەگەڵ پاشا هیرەقلدا لە « بیت المقدس » بوون • ئـەوە بوو بە پەلە کۆمەکییەکی زۆریان بۆ نارد •

رۆمەکان بە ماوەیەکی کەم لەشکرێکی دووصــەد هەزاریان کۆ کردەوە : صەد هەزاری رۆمانیی بوو کە تێودۆری برای پاشا هیرەقل سەرکردەی بوو • وە صەد هەزارێشــی لە هۆزە عـەرەبە بــەگاوربووە نۆکــەرە پارەپەرستەکان کۆ کرابوویەوە • هەموویشی لە شاری « مآب »[1] کۆ بووبوویەوە •

---

(١) شاری کەرەکی ئێستا لە وڵاتی ئەردەن •

لەشکری موسڵمانەکان ئەوە بوو «وادي القرى» ی بەجێ هێشت و سنووری دوورگەی لە نزیك تەبووکدا بڕیی و بە ناو خاکی شامدا ڕۆی هەتا گەیشتە شاری « مەعان » ، ناوچەی بولقاء لە ئەردەن ..

لەو شارەدا زەیدی کوڕی حارىثەی فەرماندەی گشتیی موسڵمانەکان ، لەو سەربازە موسڵمانانەوە کە ناردبوونیە ناو خاکی دوژمنەوە بۆ هەواڵزانین ، هەواڵی ژمارەی لەشکری ڕۆمەکانی زانیی کە دوو صەد هەزارە و بە دەیانی هەزاریش ئەسپسواری پڕچەکیان لەگەڵایە ..

خێرا ئەم پرسیارە هاتە بەر دەمی :

ئایا لەشکرێکی بچکۆلەی سێ‌هەزاریی ئەتوانێ لە بەر دەم دووصەد هەزار جەنگاوەرا بوەستێ و دامەزراو بێت ، چ جای شکاندنی دوژمن و سەرکەوتن بە سەریا ؟

بە وێنەی فەرماندەیەکی موسڵمانی شارەزا ، لە خۆیەوە بڕیاری نەدا ، بەڵکو هەموو ئەمیرەکانی لەشکر

و فەرماندەکانی کەتیبەکان و سەرۆکی هۆزەکانی بانگ کرد بۆ کۆبوونەوەیەکی پەلە تا ئەم هەواڵە ببیستن و بڕیارێکی لە سەر بدەن •

لە ئەنجاما رای فەرماندەکان هاتە سەر دوو شت :

هەندێکیان رایان وا بوو جەنگ نەکەن تا پرس بکەن بە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ • وە هەندێکیان رایان وا بوو بچن بە گژ دوژمنا • دوای دوو رۆژ لە وت و وێژ ، رای دووەم پەسەند کرا و بڕیاریان دا بچن بە گژ دوژمنا •

زەیدی فەرماندە چاوەڕوانی بڕیاری موسڵمانەکان بوو •• بینی وا بە جارێکا حەزیان لە هێرش و جەنگە •• حەزیان لە شەهیدیی و بەهەشتە •• ئەویش ـ خوا لێی رازیی بێت ـ وە نەبێ لەوان کەمتر عاشقی شەهیدیی و بەهەشت بێت ، بۆیە فەرمانی دەر کرد بۆ هەموو بەشەکانی لەشکر تا لە مەعانەوە بەرەو رووی رۆمەکان و عەرەبە بەگاور بووەکان بکەوێتە رێ ••

له هەمان کاتا رۆمەکانیش ، بەرەو موسڵمانەکان ، لەشکرە گەورەکەیان خستە رێ .. لەشکری چی ؟ لەرزەی بە زەویی خستبوو .. ئەتوت زنجیرە شاخێکە و کەوتۆتە رێ .. تەپ و تۆز و نرکە و گاڵە و دەنگی دهۆڵ ، لە ئاسمانا خەست بووبوونەوە ..

موسڵمانەکان هاتن سەیر ئەکەن وا لەشکری زۆر و زەبەندە لە دێیەك لە دێیەکانی بولقاءدا کە پێی ئەوترا : مەشاریف ، سەربازگەی دروست کردووە .

ئەبێ رۆمەکان چۆن سەیری ئەو لەشکرە بچکۆلەیان کردبێ کە لە هەموو بارێکەوە بۆ بەراوردکردن نەئەشیا ..

موسڵمانەکان ورەیان بەرز بوو ، چونکە بە راستیی ئیماندار بوون و مان و مرنیان بە لاوە یەکسان بوو .. یا سەرکەوتن وە یا شەهیدیی ..

پرسیاری دێتە بەر دەممان :

رۆمەکان کە بیستیان وا موسڵمانەکان بە لەشکرێکی

سێ‌هەزارییەوە هێرش ئەکەنە سەریان ، چ پێویستی ئەکرد لەشکرێکی دووصەد هەزاریی پڕ چەك و تفاق بخەنە ڕێ و بە سەرکردایەتیی تیۆدۆری برای پاشا بەرەو موسڵمانەکان بکشێ ؟ هەرچەندە هەندێ مێژوونووس ئەڵێن ، هیرەقلی پاشا خۆی فەرماندە بووە !

ئەمە بە جوانیی پێمان ئەسەلمێنێ سام و هەیبەتی موسڵمانەکان تا چ ڕادەیەك لە دڵی کافرانا جێی خۆی کردۆتەوە ..

ئەوە ئەگەیەنێ کافران هەر زۆر زۆر بە بەرز و ئازا و بە هەڵمەت و بە جەرگ سەیری موسڵمانەکانیان کردووە ، بە ڕادەیەك سەربازێکی موسڵمانی بێ‌تفاق حەفتا سەربازی تیر و تەسەلی بۆ بخرێتە مەیدانەوە ..

ئەوە غیرەت و ناو و ناوبانگی ئەو ڕۆژەی موسڵمانان بوو ، بۆیە بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا هەڵمەتیان ئەدا و بە دەستێ شمشێر بۆ مل پەڕاندنی ملهوڕ و ستەمکاران ، وە بە دەستێکیش قورئان بۆ

هیدایەتدانی گەلە چەوساوەکان ••

ڕۆمەکان وەها نیازیان بوو بە یەك لێدان ئیسلام و لەشکری ئیسلام شوێنەواری نەمێنێ ؟ زیاد لەوەی ترس و لەرزێکی زۆری هێزی بازووی موسڵمانەکان چووبووە دڵیانەوە ، بە تایبەتیی دوای تێك شکانی قەڵای سەختی جوولەکەی خەیبەر بە دەستی لەشکری موسڵمانەکان لە ساڵی پێشوودا ••

زەیدی فەرماندە لەگەڵ کۆمەڵەی ئەرکانی لەشکردا دەستیان کرد بە نەخشەکێشان بۆ جەنگ ••

خوا یارمەتیی دەرە ••

لەشکری ئیسلامیی ، وەك بچووکە ، وەهایش تازەیە •• لە کۆمەڵە ئادمیزادێك دروست بووە کە لەوە و پێش بەژداریی جەنگی وەها گەورەیان نەکردووە • بگرە فەرماندەکەیان بەندەیەکی خزمەت گوزار بووە ، لەشکری ڕۆمیش چەند صەدەیەکە بەژداریی جەنگە جیهانییە گەورەکان ئەکا ، بە تایبەت لەگەڵ ساسانییەکانا ••

که نەخشەیان کێشا ، ئەوەیان خستە پێش چاو ، تیۆدۆر بیر لە شێوازی گەمارۆدان بکاتەوە و ئەو کاتە بە ئاسانیی بتوانێ ، یا بە جارێ لە ناویان بە رێ ، وە یان ناچاری خۆبەدەستەوە دانیان بکات .

ئەمە زۆر ئاسانە بۆ لەشکرێکی وەها گەورە ، بتوانێ لەشکرێکی وەها بچووك گەمارۆ بدات و ویستی خۆی ، لە کوشتن و بڕین و بە دیل گرتن ، بە دیی بێنێ ..

هەروایش بوو ، تیۆدۆر هەر لە سەر ئەو بناغەیە نەخشەی کێشا بوو بۆ لەشکرەکەی و هەرگیز نەئەهات بە بیریا لە کاتژمێرێك زیاتر جەنگ بخایێنێ و لەشکری موسڵمانەکان بە سەر زەوییەوە ما بێ !!

ئەگەر تیۆدۆر ئەمەی بۆ هەر کەسێ باس بکردایە، ژیریی پەسەندی نەئەکرد یەکێ بتوانێ وتەکانی بەرێتە دواوە .. یان لەناوبردنی یەکجاریی وە یان خۆبەدەستەوەدانی دوا سەربازی موسڵمان .. چونکە ئەو لەشکرە دووصەد هەزارییەی رۆمەکان ٣ پەنجا

هەزاری ئەسپ‌سوار بوون ، ئەو صەد و پەنجاکەیشی بە ئاسن و زرێ و قەڵغان و چاكترین كڵاوی پۆلا خۆیان داپۆشی بوو ..

كورتەكەی لەشكری رۆم ، تا ئەو رۆژە ، لە چاكترین و تەواوترین لەشكرەكانی جیهان بوو لە مەشق و چەكدا ..

زەیدی فەرماندە ، چونكە خوای لەگەڵا بوو ، ئەمەی زۆر چاك ئەزانیی ، بۆیە پێش دەستپێكردنی جەنگ بیری لەمە كردەوە و نەخشەی بۆ كێشا ، لای دایە دێی ( موئتە ـ مؤتة ) و سەربازگەی تیا دروست كرد ، تا لەو شوێنەدا دوژمن نەتوانێ چوار دەوریان بگرێ .

ئینجا كاری سەرشانی هەموو فەرماندەیەكی دیاریی كرد : پیاوماقووڵێكی نەوەی عوذرەی كردە فەرماندەی دەستە راستی لەشكر ؛ كە ناوی قوطبەی كوڕی

قەتادە[٢] بوو ، وە عەبایەی کوڕی مالیکی ئەنصاریی کردە فەرماندەی دەستە چەپی لەشکر .

بەڵام دڵ و ناوکرۆکی لەشکر هەرسێ فەرماندەکەی لەگەڵا بوون : زەید و جەعفەر و کوڕی ڕەواحە .

هەر ئەوەندە بوو لەشکری موسڵمانەکان دابەزییە موئتە ، ئیتر شالاوی لەشکری ڕۆم رووی تێ کردن .. رووی تێ کردن بە فیز و دەمار و خۆهەڵکێشانێکەوە .. لە شێوەی شەپۆلی بە گوژمی دەریا ، چەپۆکانی بوو .. لەشکرە بچکۆلەکەی ئیسلامیش لە موئتەدا خۆی دامەزراند بوو ، بەڵام لە دوورگەیەکی بچکۆلە ئەچوو ، کە هەموو ساتێ مەترسیی ئەوەی لێ بکرێ لە لایەن دەریایەکی بان و پۆڕی سەرشێتەوە نوقوم بکرێ ..

---

(٢) ئەم موسڵمانە بوو سەرکردەی لەشکری عەرەبە بەگاوربووەکان ــ مالیکی کوڕی رافیلە ــ ی کوشت ..

بـه راستیی هەڵوێستی موسڵمانەکان هەڵوێستێکی سامناك و پڕ مەترسیی بوو .. چاو و مێشکی لـه خشتە ئەبرد وَ لە کاری ئەخستن .. جـەرگ و هەنـاوی دا ئەخست .. ئەوەتا ئەبووهورەیرە ـ خـوا لێی ڕازیـی بێت ـ ، کە یەکێ بوو لەوانەی بەژداریی موئتەیان کرد، ئـەم ڕاستیەمان بۆ دەر ئەخا کە تا چ ڕادەیەك ئەو ڕۆژە ەایەی ترس و لەرز بووە ، دوای ئـەوەی ئـەو هەمووە خەڵك و چەك و تفاق و ئاڵتـوون و ئاوریشـمە ـ لـــە دوورەوە ـ ئەبینن . ئەبووهورەیرە ئەڵێ : کاتێ چاوم بەوە کەوت چاومی لە خشتە برد .

ثابیت ـی کـوڕی ئەقرەم[٣] وتی : ئـەوە بچیتـە

---

(٣) ثابیتی کوڕی ئەقرەمی بـەلەویی : هـاوپەیمـانی ئەنصارەکان بوو .. بەژداریی جـەنگی بـــەدری کـردووە ( الرسول القـائد ـ ١٣٥ ) .. لەگەڵ عوککاشەی کوڕی خورەیلیدی ئەسەدیی ، شەهید کرا ، لەو کاتەدا کە طولەیحە ئاژاوەی داواکردنی پێغەمبەرایەتیی ، بۆ خۆی ، بە ساختە ، نابوویەوە

ئـەبووهـوڕەیرە ؟ ئـەڵێی خەڵکێکی زۆرت بەر چـاو ئەکەوێ ؟!

وتم : بەڵێ • وتی : چاوت لێمان نەبوو لە بەدرا

---

و خالیدی کوڕی وەلیـدیش هەردووکیانی کـردە چاوساغ و هەواڵزانی لەشکری خیلافەت ، کـە ئەوە بوو لە ئەنجاما لە نێوان لەشکری خالید و ئەو لەشکرەدا کە طولەیحە هەڵی خەڵەناند بوو و کۆی کردبۆوە ، جەنگی بوزاخەی مێژوویی رووی دا ••

ئەوە بوو لەشکری خالید سەر کەوتو طولەیحـە دوای تێکشکانی ، لە داواکەی پەشیمان بوویەوە و تەوبەی کـــرد و گەڕایەوە سەر ئیسلام • جـــا ئەگێڕنەوە ئەبووبەکر ـ خوا لێی رازیی بێت ـ روو ئەکاتە طولەیحە و پێی ئەڵێ : چۆنم خۆش بوێیت ، تۆ ئـەو دوو پیاوچـاکەت کوشتن ، عوککاشەی کوڕی موحصین و ثابیتی کوڕی ئەقرەم ؟ طولەیحە وتی : خوای گەورە بە دەستی من رێزی بـەوان بەخشیی ( بە وەرگرتنی پلەی شەهیدیی ) ، بەڵام بە دەستی ئەوان منی ریسوا نەکرد ( تا بە کافریی بی کوژن ) ••

( چۆن خوای گەورە پشتی کافری زۆر و زەبەندەی بۆ داین بە زەبیدا ) ئێمە بە زۆریی لەشکر سەر ناکەوین !

جا کێ گلەیی لە ئەبوو هورەیرە ئەکا ؟ لە هیچ کەس گلەیی ناکرێ ، کاتێ کێشانە و پێوانە دا بنێ بۆ ئەو دوو لەشکرە و دوای بەراوردکردنیان بە تەماى تیاچوونی موسڵمانەکان بێ ، نەك شکان ، بەڵکو تیا چوون .. تیاچوونی یەکجاریی ، کە بریتیی بێ لە ریشەکەن بوونی ئیسلام بە تەواویی ..

خۆ ئەگەر لەشکری ئیسلام ، کە ژمارەی لەشکری رۆمی زانیی ، بڕیاری گەڕانەوەی بۆ مەدینە بدایە بە بێ جەنگ ، هیچ گلەیەکی لێ نەئەکرا . بەڵام ـ هەر چەندە ئەیان توانیی بکشێنە دواوە ـ بڕیاریان دا خۆیان بدەن لە لەشکری کافران ، ئیتر ئەوە بوو بەرەو موئتە هەڵمەتیان دا ..

کەسێ نیە لە جیهانا دانی پیا نەنێ کە ئەم هەڵمەتە و ئەم بڕیارە چەندە پڕ مەترسییە .. وە هەر لەشکرێك

و هەر فەرماندەیەك بە كاری وا هەڵسێ ، بە یاسای سەربازیی ، سزا ئەدرێت .. بە تایبەتیی لەم چەرخەدا ، هەر سەركردەیەك ئەو بڕیارە دەر بكات بۆ هێرش و جەنگ‌كردن ، وەك ئەوەی كە زەیدی كوڕی حاریثە و یارمەتیی‌دەرەكانی دەریان كرد ، ئەزا راستەوخۆ ئەدرێ بە دادگا ، گوایە ئەمە مەبەستی فەوتاندنێكی مسۆ ەری لەشكر بووە .

بەلام لەشكری قورئان جیاوازە ..

فەرماندە ، بۆ ئەم جۆرە كارانە ، نادرێ بە دادگا ، چونكە دوای متمانەیەكی تەواو فەرماندەیەتیی پێ سپێرراوە .. ئینجا چ فەرماندە و چ سەربازان ، هەر هەموویان ، چەندێ بە تەمای شەهیدیین ، ئەوەندە بە تەمای ژیانی دونیا و سەركەوتن تیایا ، نین . شەهیدبوون لە پێناوی خوادا ، ئاواتی راستەقینەی ئیمانداران‌ە ، تا بە كۆمەكیی خوا ، بگەنە بەهەشتی نەبڕاوە ..

# بلیسەی ئاگری جەنگ

هەرسێ فەرماندەکە : زەید و جەعفەر و کوڕی ڕەواحە ، لە ریزی یەکەمی پێی پێشەوە و لە بەشی دڵی لەشکردا وەستان .. بەرامبەر دوژمنی زۆر و زەبەندە وەستان .. بە دڵێکی پڕ لە هێزی کۆڵنەدەرەوە، بە سەری بەرزەوە ، وەستان .. گیانەکانیان زۆر هەزران ئەدایە قەڵەم .. چونکە لەگەڵ خۆشەویستی ناو کرۆکی دڵیانا مامەڵەیان ئەکرد.. گیانە نوورانییەکانیان بە خوا ئەفرۆشت ..

چوونە پێشەی پێشەوە ، تا لە پێش هەموو سەربازێکەوە شەهیدیان دەست کەوێ .

ئەی کێ کاروباری لەشکر بەرێت بە ڕێوە دوای شەهیدبوونی ئەوان ؟

ئەگەر لەشکرێ وەك ئەوان خۆی فرۆشتبێ بە خوا، خوای گەورە خۆی پارێزگاریی بۆ ئەنێرێ ..

« وكفى بالله وكيلا » الاحزاب/٣ .

« وكفى بالله هادياً ونصيراً » الفرقان/٣١ .

« وما النصر الا من عند الله » الانفال/١٠ .

لەشکری قورئان خوێن چاوی بڕیی‌بووە ئاسمان، تا لە ڕەحمەت و سۆزی بە لێ‌ماژی بڕژێنێ بە سەریا .. ئەم بەرامبەر بە کافر وەستانەی و بە هەرزان دانی خوێنەکەی بە کردەوەی چاك بۆ بژمێرێ و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بکا ..

جەنگ دەستی پێ کرد .. لە بەرزترین پلەدا موسڵمانەکان دامەزراویان نواند .. بە ڕاستیی تەنها ئیمانی ڕاستەقینەیە ورە و پێزی ئادەمیزاد بگەیەنێتە ئەو پلەیە .. دەریایەك هێرش بێنێت بۆ دوورگەیەکی بچکۆلە و هێشتا شەپۆلە بەتەوژمەکانی بە توندیی بگێڕێتە دواوە ..

بەڵێ، بیروباوەڕی دامەزراو و لێبڕان و کۆڵ نەدان بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای « لا اله الا الله »، هەموو یاسایەك، کێشانە و پێوانەیەك، ئەگۆڕێ . ئەیسەلمێنێ کەوا مەرج نیە هەموو جارێ سەرکەوتن بە زۆریی تفاق و لەشکر بێتە دیی ..

لەشکری ڕۆمەکان جار لە دوای جار شالاوی

ئەهێنا •• سەربازەکانی ئیسلامیش ، بێتفاق ، لە بەر دەمیانا ، مەردانە ، وەستا بوون •• شەپۆلەکانی لەشکری خوانەناس خەریك بوو بە جارێکا خواناسەکان قووت بدات ••

ئەبوایە ئەم جەنگە نەشیاو و ناهەمرارە چەند سایکی کەمی بخایاندایە •• ئەبوایە بە یەك لەیشتن و تەواوکردنی موسڵمانەکان پێکەوە بوایە ، ( هەر وەك سەرکردەکای رۆم بیریان لێ ئەکردەوە ) • کەچی بە پێچەوانەوە ، ئەوەی کە کەسێ بە تەمای نەبوو هاتە دیی •• لەشکرە بچکۆلە ئەوپەری غیرەتی نواند • پاڵەوانانە دەستی ئەوەشاند • زۆر و زەبەندە لاکی گاور دەشتی داپۆشیی •• جەنگ حەوت رۆژی خایاند ••

سەربازە کۆڵنەدەرەکانی قورئان ••

سەربازە بەوەفاکانی پێغەمبەری خوا ••

سەلامتان لێ بێ ••

سەلامتان لێ بێ لە هەموو موسڵمانێکی بەغیرەتەوە ••

خۆم بە خەجاڵەت ئەزانم •• تووکی لەشم گرژ بوون ••
مووچڕکەم بە لاشەدا دێت •• چاوم فرمێسکیان تیا
قەتیس ماوە ، کاتێ کەمیتان و زۆریی دوژمن دێنم بە
بیرەدا ••

چۆن بەرەتان ئەگرت ؟

چۆن زیرەتن نەئەکرد ؟

چۆن دەستتان شمشێری ئەگرت ؟

دیارە وەڵامیش ئاسانە :

کۆمەکیی خوا •• یارمەتیی خوا •• پشتیوانیی
خوا ، بۆ ئەوانەی دڵیان پڕە لە ئیمان ••

لەو رۆژە ناسکەدا و لە خاکی کافردا •• گەورەترین
هێزی کافری ئەو رۆژە •• ئێوەی قارەمان لە بەر دەمیا
بەوپەری غیرەتەوە شاڵاوەکانیان پەرچ ئەدرایەوە ••

خۆشەویستەکانم •• خوای گەورە گەیشتە فریای
ئێوەی بە غیرەت •• خوا یارمەتیی ئێمەش بدات ، لەو

سەرچاوە پاکەوە کە ئێوە پەروەردەتان لێ وەرگرت ، پەروەردە و رگرین ..

بەڵێ .. غیزەتی موسڵمانەکان بە شێوەیەك بوو ، هەرچەندە لەشکری دوژمن یەك لە دوای یەك هێرش و ماڵاوی ئەهێنا ، بەڵام توانیان بیوەستێنن ..

بەڵێ ، لە هێرش و بۆ پێمەوە هاتن بیوەستێنن . سەلماندیان غیرەت تەنها لای موسڵمانە .. دوای وەستاندنی رۆم ، خۆیان بەوەوە نەوەستان .. ئەمجارە تۆبەی دەست و بازووی موسڵمانە شمشێر دا رێتە خوارەوە بۆ سەر کڵاوی پۆڵا و زرێی کۆز .. ئەمجارە موسڵمانەکان هێرشیان دەست پێ کرد .. بە صەدەها لاشەی رۆم و عەرەبە نۆکەرەکانیان لەو نازەدا خستن ، بەڵام هێرشەکان کاریگەر بوون ..

هەر مردن نیە ؟

لەمردن بەولاوە چی تر هەیە ؟

خۆ ئەگەر دەستیش نەوەشێنن ، دوژمن دەستی وا

له کارا درێغیی ناکات • وا چاکه هەر موسڵمانێك بەر له شەهیدبوونی چەند لاشەیەك له کافران بخات •

زەیدی فەرماندە له پێشی پێشەوە ڕو •• ئەوی خزمەتگوزار و بچکۆله و نەناسراو ، ئیسلام گەیشتە فریای و دەرووونی ، پێشکی ، هەموو ئەندامێکی ڕزگار کرد •• حەیف نیە ئەمڕۆ خۆی نەفرۆشێ بە خوای گەورە ؟

لە پێشی پێشەوە هەڵمەتی ئەدا و موسڵمانەکانی هان ئەدا و هەریەکەیان چەند قاتی شێر هەڵمەتی ئەدا •• کافری خوانەناس چیە ورە بە موسڵمان بەر بدا ؟
ئەم هێرشانەی موسڵمانەکان وایان کرد بەشێك لە لەشکری رۆم دەست بداتە را کردن •

جا چۆن را نەکات ؟ لە بەردەم کێدا بووەستێ ؟ لە بەر دەم موسڵمانێکا درەنگیە بگاتە بەهەشت ؟ سەربازێ بۆ پارە و رابواردن هاتبێ ، پیاوی مەیدانی شەهید ویستان نیە !

کوان ،وسڵمانه شەهید ویستەکانی ئەم چەرخە ؟
سوپاس بۆ خوا سەرانسەری سەرزەویی پڕیەتی لێیان و هەروو رۆژێکیش ئەیسەلمێنن کە :

شوێنکەوتووە راستەقینەکانی قورئان ـ ئەگەرچی هێمتا لـە چاو کافراندا زۆر کەمن ـ هەموو دەمێ ئاواتی شـەهیدیی ئەخوازن .

بەڵام زۆربەی لەشکری کفر هەر خەریکی جەنگ و کوشـتار بوو ، هەوڵی ئەدا بە هـەر شێوەیەك بووە چراردەوری موسڵمانەکان بگرێ .. بەڵام بێهوودە بوو و هەموو جارێ دەستی لە بنی کەنووی خاڵیـەوە دەر ئەچوو ..

یەکـەم بەڵگەش بەرگـەگرتنی موسـڵمانەکان و بەردەوامیان بوو لەو جەنگە ناهەموارەدا بۆ ماوەی حەوت رۆژ ، مەگـەر تاریـکایی شـەو لە یەکتـریی جیـای بکردنایەتەوە .

لەشکری ئیسـلام بـە شێوەیەکی بیرلێنەکراوە

خەریکی جەنگ بوو، تا رۆژی شەشەم، وە ئەوە بوو لەو رۆژەدا هەرسێ فەرماندەکە بە سەری بەرزەوە دەستیان لە ملی شەهیدیی کرد .. بە شەهیدبوونی هەر سێکیان لەشکری موسڵمانەکان ئەو هێز و پێزەی نەما .. بەڵام خوای گەورە خۆی نەخشە ئەکێشێ . خۆی دەرمانی هەموو دەردێك ئەنێرێ . کۆمەڵی خواناس کە لە گەڵ خوادا راست ئەکات، دەی ئیتر مسۆگەرە پەروەردگار نەخشەی سەرفرازیی بۆ ئەکێشێ . ئەوە بوو خالیدی کوڕی وەلیدی گەیاند ..

هەر سێ فەرماندەکە تا پێنج رۆژ هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە لە پێشی پێشەوەی لەشکردا بوون ئەجەنگین .. بەم دەست و بەو دەست ـ بە کۆمەکیی و پشتیوانیی خوا ـ شاڵاوی هێرشی لەشکری بێپایانیان ئەگێرایەوە دواوە، زیاد لەوەش یەك لە دوای یەك هەڵمەتیان ئەدایە سەریان تا بە راست و بە چەپا لاشەی بێسەر و سەری بێلاشەیان لە مەیدانا لە سەر یەك تەپە کەن ..

# شەیدای شەهیدیی

ئەوە بوو لە رۆژی مەشمدا ، زەیدی فەرماندەی یەکەم ، لە پێشی ریزەکانەوە، ئالآی لەشکری بە دەستەوە گرتبوو .. ئەو ئالآ سپیەی کە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە قەراغی مەدینەدا دای بە دەستیەوە، پێش ئەوەی لەشکر بکەوێتە رێ ..

ئەو رۆژە لەشکری رۆمەکان بە تەواویی زۆری سەند .. فەرماندەی خوانسیش پالەوانانە ، شێرانە ، مەردانە ، لە بەر دەمیانا وەستا ..

لە هەموو لایەکەوە رمی کافری ئاراستە کرا .

زامێك و دوان نەبوون .

هەموو گیانی هەنجن هەنجن کرا ..

رمی خرانەوان ، لە هەموو لایەکەوە بێ پەروا گۆشتی ئەبڕیی ..

کافر مئەتی نەبێ ••

هەزارەها شەهید بن ، نەمامی ئیسلام ، ئینجا زیاتر گەشەدار ئەبێ •

شەهیدان بۆ بەهەشت ئەڕۆن •

ئەو جۆرە بلیتەی بەهەشت دەستی هەموو کەسێ ناکەوێ •• پیاوی ئەوێ و دەستی بێگاتێ •• لاشەی زەیدی پاڵەوان ، بە رمی دوژمن کون کون کرا •• هەتا توانای تیا بوو خۆی گرت ، تا نەهێڵێ ئاڵای لەشکر بکەوێتە زەویی، تا ئەوە بوو جەعفەری فەرماندەی دووەم دەستی دایە ئاڵا و لە زەیدی وەر گرت ، بێ ئەوەی بکەوێتە زەویی ••

رەنگ‌زەرد و خەجاڵەت خۆمان ، زوربەی موسڵمانانی چەرخەکانی دواوە • نەمامی ئیسلامی ئازیز بە خوێنی کێ ئاو درا و گەشەی کرد و سایە و سێبەری پێ گەیشمت ، وە کێیش لە سێبەرەکەیا خەریکی بڕینەوەیەتی ؟!

پلەی بەرزی شەهیدان لە کوێ و رووی رەشی ئایین فرۆشان لە کوێ ؟!

با هەر کەسێ ، کە خۆی بە موسڵمان ئەزانێ ، سەرنجی خۆی بگرێ : بزانێ لە پێناوی ئیسلامدا ماندووبوونی زۆرە ، یان ئەو خزمەت و پایە دنیاییەی کە بە هۆی هەڵگرتنی ئیسلامەوە پێی دراوە ؟

ئەگەر راستگۆ بین و ئەم بەراوردە بکەین ئەوسا ئەزانین چەند رووڕەشی دیوانی خواین !

گوایە ماومانە رووڕەشیی ئەم جیهانە بێت بە سەرمانا؟ دەی با هەر بەو پێیەش بە تەمای قیامەت بین !

هەر چۆن بوو شەهیدان گەیشتنە مەنزڵی راستەقینەیان و پێغەمبەری خوایش ـ صلی الله علیه وسلم ـ ، هەر لەو رۆژەدا ، هەواڵی شەهیدبوونەکەی دا بە موسڵمانەکان ..

ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ چووە سەر مینبەر و باسی هەر سێ شەهیدەکەی کرد ،

ئەمەش دوای ئەوەی خوای گەورە مەیدانی جەنگ و روداوەکانی هێنایە پێش چاوی پێغەمبەر •• بۆی باس کرد کەوا زەید پێوانە دەستی داوەتە ئالا و شەیتانیش هاتۆتە لای و ژیانی بە لاوە خۆشەویست و مردنی لە لا ناخۆش کردووە و خۆشەویستیی ژیانی دنیای بردۆتە دڵیەوە ، کەچی زەید پێی وتووە : ئا ئێستا ، لە کاتێکا ئیمان لە نێو دڵەکانا جێگیر بوژە ، ژیانی دنیام بە لاوە خۆشەویست ئەکەی ؟ جا بەرەو پێشەوە هەڵمەتی دا •• پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ رەحمەت بارانی کرد و فەرمووی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن ، بە هەڵمەتەوە چووە بەهەشتەوە •

کاتێ کە جەنگ تەواو بوو و پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەواڵی پێ گەیشت خەفەتێکی زۆری خوارد بۆ شەهیدبوونی هەر سێ فەرماندەکەی کە لەوەوپێش خەفەتی وای نەخوارد بوو •• بۆیە سەری دا لە کەس و کاریان بۆ دڵدانەوە و سەرخۆشیی لێکردنیان ••

کە گەیشتە ماڵی زەید کچە بچکۆلەکەی بە پرمەی

گریانەوە خۆی گەیاندە پێغەمبەری خـوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ هەر وەکو بڵێ : بارکم شەهید بووە و جگە لە تۆ ، کە لە جێگەی باوامانیت، کەسی ترمان نەبەین • •

هەڵوێستی ئەم کچە کاری کردە سەر پێغەمبەری خوا و دەستی کردە گریان بە رادەیەك دەنگی گریان و هەنیسکدانی بـەرز بوویـەوە • فرمێسك لـە چاوی پیرۆزی بـە خـوڕ رژانــە خـوارەوە ، بۆ زەیـدی خۆشەویستی • ئەو زەیدەی ساڵەهای ساڵ لە گەڵیانا ژیانی ئەدایە سەر • • ئەو زەیدەی کـە نەچۆوە لەگەڵ بارك و مامەیا بۆ لای دایکی و بۆ ناو کـەس وکاری • • ئـەو زەیدەی ئەوەندەی خۆش ئەویست بە یاسای ئـەو کاتە ، تا ئیسلام قەدەغەی نەکرد بوو ، کردیە کـــوڕی خۆی • • ئەو زەیدەی کە یەکەم کەس بوو لە بەندەکانا ئیمان بێنێ •

کاتێ ســەعدی کوڕی عوبـادە ئەم گریانەی بـە پێغەمبەری خواوە بینی ، سەری سوڕ ئەما ، بۆیە پرسیی :

ئەمە چیە ئەی پێغەمبەری خوا ؟!

واتە : ئەم گریانە بۆ ؟

ئەم کارە کەی بۆ تۆی بەڕێز ئەشێت ؟

فەرمووی :

ئەمە گریانی خۆشەویستە بۆ خۆشەویستەکەی ٠

واتە : زەیدم زۆر خۆش ئەوێ ٠٠ جگەرم سووتاوە بۆی ٠٠ جێگەکەی لە کرۆکی دلما چۆل بووە ٠

خۆزگەم بە زەید ٠٠ زەیدی خواپێداو ٠٠ ئەوەندە خاوەنی ناوچاوێکی رۆشنە لە سەر زەویدا ئەکەوێتە مالی موحەممەدی کوڕی عەبدوللای یەکەم خۆشەویستی خوا ٠٠ دوایش ناچێتەوە بۆ ناو کەس‌وکاری ٠٠ ئەوەندە دل و نیازەکەی پاکن ئەبێتە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ٠٠ لەو دلە پاکە فراوانەدا جێی خۆی ئەکاتەوە ٠

خۆزگەم بە زەید ، وا بووە قوتابیی راستەقینەی قورئان ..

خۆزگەم بە زەید ، وا بووە سەربازی بە وەفا و فەرماندەی چاونەترس و فیداکاری لەشکری ئیسلام ..

خۆزگەم بە زەید ، وا بووە یەکێ لە شەهیدە ناودارەکانی ئوممەتی ئیسلام و بەهەشتی بەرینی بۆ هەتا هەتایی مسۆگەر کرد ..

خۆزگەم بە زەید و هاوبیرانی زەید ..

لە کۆتاییدا داواکارین خوای گەورە لە سەر ڕێبازی قورئان لامان نەدا و بە موسڵمانانە سەر بنێینەوە ..

واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين .

# سەرچاوەکان


| پەڕاو | دانەر |
|---|---|
| ١ ـ الاستيعاب | ابن عبدالبر |
| ٢ ـ اسد الغابة | ابن الاثير |
| ٣ ـ الاصابة | ابن حجر العسقلانى |
| ٤ ـ حياة الصحابة | الكاندهاوي |
| ٥ ـ الرسول القائد | خطاب |
| ٦ ـ السيرة النبوية | ابن هشام |
| ٧ ـ صفة الصفوة | ابن الجوزي |
| ٨ ـ صور من حياة الصحابة | الباشا |
| ٩ ـ غزوة أحد | باشميل |
| ١٠ـ غزوة مؤتة | باشميل |

# ناوەرۆك

